# سپارتاکۆس

## شۆڕشی کۆیلە ڕاپەڕیوەکان

٧٣ - ٧١ ی بەرلەزاینی

برهان قانع

١٩٨٤

# سپارتاکۆس

## شۆڕشی کۆیلە ڕاپەڕیوەکان

٧٣ ـ ٧١ ی بەرلەزاینی

برهان قانع

١٩٨٤

---

ئەم نامیلکەیە بەهای مرۆڤو توڕەیی چەوساوەکان دەرئەخات.

- دیڤید کینگ ری : بە ئینگلیزی نوسیوێتیو کراوە بە فارسی
- برهان قانع : کردویە بە کوردی
- چاپی یەکەم - ١٩٨٤
- چاپخانەی (حوادث) بەغدا

## پێشکەشە :

بەو جەنگاوەرەی لە راپەڕینەکەی تێ ئەگات

● برهان ●
١٩٨٤

بۆیە ئەم نامیلکەم کرد بەکوردی بۆ ئەوەی : خوێندەواری کورد ،
لە شورشی سپارتاکوس ـ شورشی کۆیلە راپەڕیوەکان ـ تێ بگات ..

له رۆمی کۆن ، کۆیله‌کان گه‌وره ترین سه‌رچاوه‌ی ئابوری بون ، له کۆتایی سه‌رده‌می قرطاجـه‌دا هانیبال (۳۰) سی‌ی هـــه‌زار کۆیله‌ی فرۆشت •• کۆیله‌کان له ســه‌ر خواستی خاوه‌ن کۆیله سه‌رمایه‌داره‌کان له گۆڕه‌پانه‌کاندا ئه‌چون به گژ یه‌کترداو یه‌کترینیان ئه‌کوشت •• به ناو بانگترین شۆرشی ئه‌و کاته شۆرشی سپارتاکوس ، واتا شۆرشی کۆیلـــه راپه‌ریوه‌کان بو ، که له ساڵی ۷۳ ی به‌ر له زاینی دا هه‌ڵگیرساو له ساڵی ۷۱ ی به‌ر له زایین کوژایه‌وه •

# فەرهەنگۆك :

**سپارتاكوس :**

— ناوی كۆیلەیەكە رابەری راپەرینەكەی كردوە •

**هانیپال :**

— بازرگانێكی سەرمایەداری كۆیلەفرۆش بوە •

**رۆم :**

— ئیتالیا •

**گلادیاتۆر :**

— ئەو كۆیلانە بون كە سەرمایەدارەكان بۆ كات پێ بردنە سەری خۆیان ئەیانكردن بەگژ یەكداو سەیریان ئەكردن •

**كاپۆ :**

— شارێكی گەورەی ئەو سەردەمەی وڵاتی رۆم بووە كە گۆرەپانی كۆیلە كوشتنی تایبەتی تیا بووە •

**ئالپ :**

— چیا یەكی گەورە یە لە ئیتالیا (رۆم) •

**كراسوس :**

— سەرمایەدارێكی خاوەن كۆیلەی ئەو كاتە بووە •

**سیسیل :**

— دورگەیەكی كشتوكاڵی گەورەیە لە خوارووی وڵاتی (روم) ئیتالیا •

**بروتیوم :**

— چیایەكی گەورەیە ، ئەمیش هەر لە ولاتی رۆمدایە •

**سزار :**

— ئەمپەراتۆری ئەوسای رۆم •

**پەمپە :**

— سەرداری ئەوسای رۆم بووە •

ئێوه ناوی گەلێك لە شكرکەشی و دەسەڵاتدارە گەورە جیها نگیرە کانتان بیستووه ، کـــه چەندان وڵاتیان لە ژێر سمی ئەسپەکانیانا وێران کردوەو ژن و پیاوو پیرو جوانیان لە خوێنا گــەوزا ندوەو چــەندان ناوچەی ئــەم سەرزەمینەیان کردوە بـــه گۆمی خوێن .. چـــەندان منارەیان لـــه کاســەی سەری ئادەمیزاد دروست کردوە ، چەندان پێ لە قەیان لە شارستانێتی ئەم جیها نە فراوانە داوە .. بەڵام باوەڕ ناکــەم ناوی «سپارتاکوس» تان بەو جۆرەی کە بووە بیستبێ وەیان بە باشی لێی شارەزا بو بن ..

ئینجا بۆ ئەوەی بەباشی لە «سپارتاکوس» بگەن ئەم نامیلکە یـەتان پێشکەش ئەکــەم .

– وەرگێر –

**به کورتی :**

سپارتاکوس کۆیلەیەکی زیرەكو ئازای ئازادیخواز بـــوو ، سەرداره گەورەو دەوڵەمەندە خاوەن کۆیلەکانی ئەو سەردەمەی وڵاتی رۆم(۱) «ئیتاليا» زۆر رقیان لێی ئەبۆوه • ئـــەو کـــارانەی کردوێتی مەبەستی خۆدەرخستن,و پاداش وەر گرتن و وڵات داگیر کردن نەبووه ، بەڵـکو وەکو ئازادیخوازێك هەمیشە ویستوێتی ئادەمیزادی کۆیله لـــه ژێر باری زۆرو چەوساندنەوەو ستەمی چینایەتی دا رزگار بکات •

ئەم شۆرشگێرە ناوی لـه ســـەر زمانو قەڵەمی گەلێك لە مێژوو نووسەکان هاتووە ، ئینجا لەبەر ئەوەی هەندێك لـه مێژوو نووسەکانی ئەو کاتە(۲) پەروەردەی دەرباری دە وڵەتەکانی سەر دەمی خۆیون بون هەمیشە زمان و قەڵەمەکانیان بۆ خزمەتی قازانجو ناو بانگی فەرمانڕەواکان تەرخـــان کردبو •

بەڵام ئێوە کە هەمیشە لە زۆرو ستەم بێزار بون ، زۆر جێـــگای خۆیەتی کەناوی «سپارتاکوس» رەوان بکەنو هەمیشە لە ســـەر زمانتـــان

---

(۱) سەدەکانی بەر لە زایینی یە ، بە تایبەتی سەدەی یەکەم •
(۲) هەمان سەردەم ئەگرێتەوە •

بێت • • هەمیشە بیر لە راپەڕینەکەی بکەنەوە • بە تایبەتی کـە ئەتوانن بیکەنە سەرمەشقی کاری شۆرشگێڕانەو خۆ رزگار کردنتان •

★ ★ ★

لە هاوینی ساڵی ٧٣ ی بەر لە زاینی دا ژمـارەی دوو سەد «گلادیاتور»(١) ، یان بڵێین کۆیلەیان ئەبرد بۆشـاری «کاپۆ» کە یەکێك بووە لە شـارە هەرە گـەورە کانی ئەو سەردەمەی وڵاتی رۆم ، تاکو بیاندەن بە شـەڕ لەگـەل یەکترداو بیانکەن بـە گژ یەکداو بە یەکتر بە کوشتیان بـدەن •

چونکە لـەو سەردەمەدا سـەرمایەدارە خاوەن کۆیلەکان هـەر یەکەیان ژمارەیەك کۆیلەی هەڵ ئەبژاردو ، وەکو باو بووە لە رۆژێـکی دیاریکراو دا لە یەکێك لە شارەکان ، لەگۆڕە پانێکی گەورە دا ئەیاندان بـە شـەڕو ئەیانکردن بەگژ یەکداو ئەوانیش لە گەل ماڵو خێزانە کانیانا سەیریان ئەکردن •

ئەو کۆیلانە هیچ هیوایەکیان بە ژیانو چارەنوسی خـۆیان نەمابو ، ئەویش سەربارەت بەو بارو دۆخو سیستەمی کۆمەڵایەتی‌یە نالەبارو پڕ لە چەوساندنەوەیە کە مرۆڤی کۆیلەو هەژار هیچ پایەو بەهاو رێزێکی تیـایا نەبو • ئەمانە بە نهێنی رێکەوتن و بە دزی یەوە بەڵێنیان بە یەکتر دا کـە بە هاریکاری یەکتر راپەڕن و ئەو بارو دۆخـە نالەبارەی کـە تیایا ئەژین

(١) بەو کۆیلانەیان ئەووت کە سەرمایەدارە خاوەن کۆیلەکان بۆ کات پێ بردنە سەری خۆیان لە یاریگایەکی گەورەدا ئەیانکردن بەگژ یەکداو ئەوانیش سەیریان ئەکردن •

ـ وەرگێڕ ـ

سەرەو ژێری بکەنەوەو خۆیانو چەندان ملیۆن کۆیلەی تری وەکــو خــۆیان لــە ژێر نیری ستەمی چینایەتیو چەوساندنەوەی کۆمەڵایەتیدا رزگــار کــەن •

لە ناو ئەو کۆیلە چارە رەشانەدا ، کە هیچ هیوا یەکیان بــە ژیانو دوارۆژیان نە مابو لاوێکی زیرەكو ئازا هەبو ناوی «سپارتاکوس» بوو ، ئەم لاوە زۆر زیرەكو هوشیار بو • بەر لەو کاتەی بـکرێ بــە کۆیلەو رەوانەی گۆڕەپانی یەکتر کوشتن بکرێ(١) لە ناوچەکانی ژورووی وڵاتی ئیتالیا «روم» شوانی ئەکردو ئاژەڵی بەخێو ئەکرد •• کاتێك کردیان بــە کۆیلە ئازادیو بیری ئازادی لەبیر نەچۆوە • بەڵـکو هاوڕێـکانی خۆیشی هەمیشە لە بارەی راپەڕینو خۆ ئازاد کردنەوە تێ ئەگەیاند •

سپارتاکوس ، ئەوەی بۆ هاوڕێ کۆیلەکانی رون کردەوە کە تێکرای ئادەمیزاد لــە مافی ژیاندا هــەمویان وەکو یەکن ، ئەو جیــاوازی یــە چینایەتی‌یەی کە لەناو خەڵـکی کۆمەڵـگا چینایەتیەکاندا هــەیە تەنیــا دیاردەیەکی کۆمەڵایەتیا نەیەو لە هەمو کاتێکدا توانای لە ناوبردنی هەیە • بەڵام ئەگەر کۆیلەکان هەمو یەك بن و پێکەوە راپەڕن ئەوا ئەتوانن ئەم بارە کۆمەڵایەتیە نالەبارە لەناو بەنو بیگۆڕن ، خۆیان لــە ژێر باری چەوساندنەوەو نیری دیلێتی رزگار کەن •

قسەکانی «سپارتاکوس» گەلێك کــاری کاریــگەرانەی کردە ســەر هاوڕێکانی ، لە ئەنجامدا سپارتاکوس توانی لە

---

(١) مــەبەست ئەو گورەپانە تایبــەتیانەیە کـــە سەرمایەدارەکــان کۆیلــەکانیــان تیا ئــەکردن بــەگژ یەکترداو خــۆیان ســــەیریان ئەکردن •

**وەرگێر**

گەڵ ٧٦ حەفتاو شەش هاوڕێی خۆی لەوانەی کــە لــە گەلیابون لە هاوڕێکانی رابکەن •

ئەوانەی لە گەڵ سپارتاکوس رایان کرد هەمویان بێ چەك بون ، تەنانەت «سپارتاکوس» خۆیشی بێ چەك بو ، بەڵام لە رێـگادا خۆیان پڕ چــەك کرد ، ئەویش بــە هۆی ئەوەوە بو لە رێــگادا دەستیان بە ســـەر کاروانێکی بارە چەکدا گرتو هەموو چەکە کانیان بردن •

کاتێك گەورەی شــاری «کــاپو» ویستی بەرگیری یان لێ بــکات ، سپارتاکۆس و هاوڕێــکانی هەمو دەستەو دایەرەکەی گەورەی شــــاریان چەك کردو بە خۆیان و چەکە کانیانەوە چونە چیایەکی سەخت(١) ••

**پەلاماری یەکەم :**

خاوەن کۆیلەکان کــە ئەم هەواڵەی راکردنو خۆ رزگــار کردنی سپارتاکوس و هاوڕێکانیان پێ گەیشت لە شاری «روم» شڵەژان •• کەوتنە خــۆ ، بۆ کپ کردنەوەی راپەڕینە کــــەیان یەکەمجار لە شکرێکی سێ هەزار کەسی یان نارده سەر سپارتاکوس و هاوڕێ شوشگیرەکانی لەچیای «ئالپ» • بەو مەبەستەی لەماوەیەکی زۆر کەمدا هەموویان بکوژن وەیان دەستگیریان بــــکەن •

بەڵام وەکو حوکمی سروشتی هەمو راپەڕینێك لە یەکەمین شەڕدا لــە نێوان هــەردو دەستەی شۆڕشگێڕە کانو لەشکری رۆمدا ، لەشکری رۆم شکاو ژمارەیەکی زۆریشیان لێ کوژرا •

---

(١) چیای «ئالپ» لە ژوروی ئیتالیا «روم» •

ئـــەم شـــكا ندنەی لەشكری رۆمەكـــان جـگە لەوەی ئازایەتیو قارەمانەتیەكی گەورەی تیـا بو لە هەمان كاتا بوو بە هاندەرێكی گەورەی لەشكرە شورشگێرە كـەی سپارتاكوس و شۆرشگێرەكان باوەڕیان بـــە خۆیان كرد كە توانای خۆ رزگار كردنیان هەیەو پشتیوانی یەكترن •

كۆیلەكانی تریش ، كاتێك ئەمەیان زانی دەستە دەستەو بە كۆمـەڵ لــەم لاو لەو لاوە رایان ئەكردو ئەچـــونە ناو ریزی شۆرشـگێرەكانی سپارتاكوسەوە •

**پەلاماری دووەم :**

جارێـكی تر ، دو دەستە لەشـكری دو هـەزار كـەسی یان ناردەوە بۆشەڕی سپارتاكوس و هـاوڕێ شۆرشگێرەكانی ، بەڵام شۆرشگێرەكان ئازایانە لێیان هاتنە دەستو هەردوو لەشكرەكەیان بە تەواوی لەناو برد •

ئەوەی شـایانی ستایشی سپارتاكو سـەئەوەیە لـــەم سەركەوتنانەدا سپارتاكوس و هاوڕێـكانی لە خۆیان بایی نەبون ، ئەقڵی خۆیان لـە دەست نەداو لـە سەر لوتكەی چیا بەرزەكان نەهاتنە خوارەوە • هەندێك جار لـە ناكاو لە شاخەكانەوە ئەهاتنە خوارەوەو پەلاماری شارە نزیكە كانیان ئەداو ژمارەیەكی زۆر لە هاوڕێ كۆیلەكانیان لە دەست كۆیلەدارەكان ئەڕفاندو بەخێرایی ئەگەڕانەوە بۆ چیا كان(١) •

**گیرو گرفتی ئازوخە :**

بەڵام ئەوەی بوو بە یەكەمین گیرو گرفت لە رێـگای زیاتر گەشـە كردنیاندا ئەوە بوو ئازوخەیان بە زەحمەت دەست ئەكەوت و زۆر جاریش

---

(١) چیا كانی دەورو بەری «ئالپ» •

هـەر بە برسی ئەمـــانەوە • بۆ چارەسەر کردنی ئەمەش ناچـار ئەبون پەلاماری شارۆچکەو لادێـکانی نزیك‌و دەورو بەری خۆیان‌و ناوچـــە نزیك دەستەکان بدەن بۆ ئەوەی ئازوخـــەیان دەست بـــکەوێ •• بەڵام سپارتاکوس ئەم کارەی پێ باش نەبو وە لەم روەوە هەمیشە سەرزەنشتی هاوڕێـکانی ئەکرد •

سپارتاکوس ئەیویست سود لەو ئاژاوەیە وەربگرێ کـە یەخەی رۆمیەکانی گرتبوو • ئەیویست خۆی‌و هـــەمو هاوڕێ شۆرشگێرەکانی دەورو بەری چیای «ئالپ» بـەجێ بهێڵن‌و بچنە دەرەوەی سنووری ئیمپەراتوری رۆم • بـۆ ئەوەی هاوڕێـکانی لە دەرەوەی وڵاتی رۆم بە ئازادی بژین•

بەڵام ، هاوڕێـکانی ئەوەندە هوشیار نەبون هەست بەم بارەبکەن ، نەیان ئەزانی لــە دوایدا وایان لێ دێت نەتوانن خۆیان رابگرن‌و لەبـەر برسێتی شپرزە ئەبن‌و توانای مانەوەیان لەو شوێنەدا نامێنێت • کـــەوابو هەرچەند زووتر سـود لەو دۆخو رۆژگارە وەربگرن باشترە •• زیاتر درێژە بە راپەڕینە شۆرشگێری‌یەکەیان ئەدەن‌و زۆر تـــر خـــۆیان را ئەگرن‌و ئەمێننەوە ••

## پەلامارێـکی تر
## بۆ سەر شورشگێرەکان

لەو کاتانەدا ، سەر لەنوێ جارێکی‌تر رۆمیەکـان چـــەند دەستە لەشکرێکی زۆریان رێکخست کـە دەستەیەکیان بە تەنیا زیاتر لـــە دە هەزار کـــەس ئەبو ، بـە سەرکردەیی سەرمایەدارە خاوەن کۆیلەکان

ناردیانن بۆ شەڕی سپارتاکوس ، لـە پاش شەڕێـکی زۆر توندو تیژ(۱) سپارتاکوس‌و هاوڕێ شۆڕشگێڕەکانی ئەمانیشیان لەناو بردو بە سەریاندا زاڵ بون •

وەکو لـــە پێشەوە باسمان کـرد سپارتاکوس هەروەکو رۆژانی ئازادی لـــە بیربو هەروەهـــا رۆژانی کۆیلەیی‌و ئازاردانـی لـــە بیر نەچوبۆوە •

لەو دیلانەی لـە مەیدانەکانی جەنگدا گیرابوون چوار سەد کەسی لە بنەماڵە خانەدانەکانی ئەو سەردەمەی وڵاتی رومی تیا هەڵبژاردن‌و هـەر بەو شێوەی کـــە خاوەن کوێلە سەرمایەدارەکـــان لە گۆڕەپانەکانا کۆیلەکانیان ئەکرد بەگژ یەکداو خۆیان سەیریان ئەکردن ، ئـەویش هـەر بەو جۆرە ئەو چوار سـەد کەسە گیراوەی ـ کە ئەندامی بنەماڵە بەرزو بەناو خـانە دانە کـانی ئەو سەردەمەی وڵاتی رۆم بون ـ لـــە مەیدانێـکی پان‌و بەریندا کردنی بـە گژ یەکداو خۆیشیان هـەموویان لەدەوریان کۆ بونەوەو سەیریان ئەکردن(۲) •

لەمەشدا مەبەستیان ئەوەبو ، هەر بۆ ئەوەی ئەوانیش تامی سـزاو ئازاری زۆر لێکردن‌و ژێر دەستەیی بنۆشن ، وە بە خەڵکی بسەلمێنین ، ئەوەی خـــەڵك ئەچەوسێنێتەوە تەنیا «زۆر»ە ، کۆیلەش بـەو هۆیەوە «زۆر»بە سـەریەوە هـــەیە ئەچەوسێتەوە •• نەك لەبـەر ئەوەی ناوی کۆیلەیە •

---

(۱) ئەم شەڕەش هەر لە چیای ئالپ‌و دەورو بەریدا بوە •

(۲) ئەمکارە وەکو کارێکی تۆڵە سەندنانەیە •••

ئەگەر کۆیلە ، زۆری بە سەرەوە نەمێنێت ئەوا ئەویش مرۆڤێکە وەکو هەریەکێك لەو خەڵکە . وە ئەگەر هاتوو هەر یەکێك لەو خەڵکە ئەو زۆرەی کە خراوەتە سەر کوێلەکان بخرێتە سەر ئەو ئەوا ئەویش وەکو کۆیلەکان ئەچەوسێتەوە .

## دەستە لە شکرێکی
## دە هەزار کەسی تر ..

سپارتاکوس ، دیسان دەستەیەکی تری لەشکری دە هەزار کەسی تێك شکاندو لە ناوی بردن ، بەڵام لە جیاتی ئەوەی دوای ئەم سەرکەوتنە گەورەیە بڕواتە پێشەوە کەچی بە تەواوی کشایەوە .. ئەمەش لەبەر ئەوەبو چونکە خەڵکی شارەکان هاریکاری یان لە گەڵا نەئەکردن و ئەوانیش لەبەر نەبوونی ئازوخە گوزەرانیان لێ تاڵ بوبو ..

سپارتاکوس بەرەو خواروی وڵات ـ واتا خواروی ئیتالیا «رۆم» ـ کشایەوە تاکو سود لە ئازوخەی ئەو شارانە وەربگرێ کە ساڵی رابوردو داگیری کردبون ..

ئەم هەواڵی کشانەوەی سپارتاکوسە بۆ خواروی وڵات گەیشتە لێپرسراوانی رۆم .. هەمو خاوەن کۆیلەکان ترسیان لێ نیشت و(١) تێکرا کەوتنە خۆ ، لەشکرێکی زۆریان ئامادە کرد بۆ بەرگرتن لە کشانەوەی سپارتاکوس(٢) .. بەڵام سپارتاکوس بێ گیروگرفت خۆی و هاوڕێ

---

(١) لێپرسراوانی ئەو کاتەی رۆم هەمو خاوەن کۆیلە بون .

(٢) رۆیشتنی سپارتاکوس بۆ خواروی وڵات بەزیانی سەرمایە دارە خاوەن کوێلەکان تەواو ئەبو .

شورشگێڕەکـانی گـەیاندە ئەو شوێنەی کـــە مەبەستی بوو ئەیویست بیـگاتێ .

سەرکەوتنەکانی سپارتاکوس بەرە بەرە ئاڵۆزی لە رۆمدا پەیـــدا کرد ـ بە تایبەتی لـەناو ریزی سەرمایەدارە خـــاوەن کۆیلەکانا ـ بـە جۆرێك کـە سامانی دەوڵەمەندە خاوەن کۆیلەکان بە تەواوی کەوتـە مەترسی یەوە ، بەو رادەیە کـە ناچار بون کارێکی وەها بکەن ـ بەهـەر نرخێك بێت ـ و بەهـەر جۆرێت سپارتاکوس‌و هاوڕێ شۆرشگێڕەکانی لەناو بەرن .

بێگومان لەو سەردەمەی وڵاتی رۆمدا هەرکەس پارەدارتر بوایـە کۆیلەی زۆر تر بووە ، لەبەر ئەوەی بە زۆری خـاوەن پارە زۆرەکان‌و خاوەن کۆیلەکان زۆر تر لە شۆرشەکەی سپارتاکوس ئەترسان .

ساماندارو دەوڵەمەندەکانی رۆم زۆر ترسیان لێ نیشت‌و لەم روەوە لـە ناو خۆیانا کەوتنـە مقۆ مقۆ .. بریاریان دا سەرلەنوێ لەشکرێـکی بەهێز تر لەوانەی رابوردو کۆ بکەنەوەو رێکیان بخەن‌و پڕ چەکیـــان بـکەن‌و بیـان نێرنە سـەر سپارتاکوس‌و هاوڕێ شۆرشگێڕەکانی .. بۆ ئـەم مەبەستە هێزێـکی یەکجار زۆریان کۆ کردەوەو ئەمجارەیان بـــە سەرکردەیی «کراسوس» کە خاون سامانێکی کۆیلەداری دەرکەوتو بو ناردیانن بۆ شەڕی شۆرشگێڕەکان .

## کراسوس کێ بو(١) ؟

کراسوس لـە سەردەمی ئەشکانیەکاندا چەند شەڕێـکی سـەختی

(١) نامانەوێ بە دورو درێژی باسی کراسوس‌و تاوانەکانی بکەین بویە بەکورتی نوسیمان

لەگـەڵ لەشکری ئیرانیەکانا کردبو ، نیزیکەی ۱٬۸۰۰٬۰۰۰ زیاد لـە ملیۆنێك و هەشت سـەد هەزار دیناری پارەی رۆمی هەبو •• زوربـەی پارەکەی لـە شەڕە ناوخۆییەکان و کوشت و کوشتاری خەڵکی رۆمدا بە دەست هێنا بوو • ئەم کابرایە زۆر لە خۆ بایی و بێ بەزەیی بوو •

## کراسوس و
## دە لەشکری شەش هەزار کەسی

لە پایزی ساڵی ۷۲ی پێش زایینی‌دا ، جارێـکی تر دە لەشـکری شەش هـــەزار کەسی‌یان دایـە دەست کراسوس بۆ ئەوەی شـــەڕی سپارتاکوس و هاوڕێ شورشگێڕەکانی بکات •

بەڵام سپارتاکوس ، کە نەیئەتوانی ئازوخەی تەواو بە لەشکرەکەی بگەیەنێت ، ناچار بو هێزەکانی خۆی کرد بە دوو بەشەوە •• بەمجۆرە هێزەکانی لاواز بون ، دەستەیەك لە لەشکرەکەی سپارتاکوس کـــە دە هـەزار کەس بون لـە شـەڕدا تێکشکان ، شەش هەزاریان کوژران و (۹۰۰) نۆ سەد کەسیشیان بە دیل گیران •• ئەوانی تریش پاشەکشەیان کـــرد •

سپارتاکوس کاتێك ئـــەم کارەساتەی دی بڕیاری دا بچێت بۆ دورگـــەی «سیسیل»(۱) لـــە خوارووی وڵاتی ئیتالیا ، لەبەر ئەوەی دورگـــەی ناوبراو دەغڵ و دانی و گەنمی زۆر بو بە شێوەیەك کە پێ‌یان ئەووت «دورگەی گەنمی رۆم» •• •

---

(۱) دورگەی ناوبراو دورگەیەکی بە پیت و بەرەکەت و توانای بەخێو کردنی شۆرشگێڕەکانی هەبو ••

جگە لەوەش دانیشتوانی ناوچەکە هەمیشە ئامادە بون بۆ شورش‌و راپەرین ..

سپارتاکوس بڕیارەکەی جێبەجێ کردو سـوارى کەشتى بون ، بەلاّم کەشتى‌یەکان بەڵێنیان شکاند ، حاکمى ناوچـەکە لەبەر ئافرەینى دەوڵەت بە هێزێـکى زۆرەوە رێـگاى بـە لەشـکرەکەى سـپارتاکوس گرت ، ئنجا سپارتاکوس ناچار بو بگەڕێتەوە بۆ ناوچەکانى « کـەنارى دورگەى ئیتالیا » .. کراسوس ئەمەى بە هەل زانى‌و بە هێزێکى زۆرەوە بەرەنـگارى وەستاو هەمو شۆرشگێڕەکانى گەمارۆ دا .

**گەمبونەوەی ئازوخە :**

زستان هاتە پێشەوەو ئازوخە زۆر کەم بۆوە ، بە جۆرێك ئەگـەر سپارتاکوس‌و هـاوڕێ شۆرشگێڕەکانى لـەو کـاتەدا لەو ئابلۆقـەو گەمارۆدانە دەر نەچوبانایە هەمویان لەناو ئەچون .. لەبەر ئـەوە بـە ناچـارى لەگـەل کراسوس کەوتنە قسە کردن‌و گفتوگۆوە ، بۆ ئەوەى ناوبژى بکرێن(١) ..

بەلاّم ، ئەمـکارە وەکو پێویست سـەرى نەگرت ، چونـکە سپارتاکوس‌و هاوڕێ شۆرشگێڕەکانى هەڵوێستیان پێچەوانەى ئارەزوو قازانجى هاوڕێ‌یانى کراسوس بون .

ئەوان ئەیانویست بـە هـەر جۆرێک بێت سپارتاکوس‌و کۆیلـە شۆرشگێڕەکانى هاوڕێى لەناو ببرێن . بەمکارە ئەوە بە کۆمەڵانى خەڵك

---

(١) ئەم گفتوگۆیە تەنیا بۆ ناوبژى کردن بۆ نەك بۆ داواکردنى مافى کۆیلەکان .

بەگشتیو ـ کۆیلەکان بە تایبەتی ـ بسەلمێنن کە هەرکەس بیەوێ شۆرش بکاتو داوای مافی خۆیو خۆ رزگار کردن بکات بەو جۆرە ئەنجام هەر ئەبێ بکوژرێ ..

هەروەها کراسوس ئەیویست بە هۆی سەرکوتکردنی لەشکری شۆرشگێرەکانو کوشتنو لەناو بردنیانەوە ئازایەتیو شانازییەك بۆ خۆی وەر بگرێو خۆی پێ گەورە تر بکات ..

**بە کورتی ..**

داخوازیو پێشنیارەکانی سپارتاکوس هەموی رەت کرایەوەو هەروەها بە گەمارۆدراوی مانەوە .

**تاکتیك ..**

سپارتاکوس زیرەکیو ئازایەتیەکی گەورەی بەکار هێنا ، شەوێك کە بەفرێکی زۆر باریبو ، لە هەمو لایەکەوە تۆفو بادەوەو زەریان بوو ـ دوژمن هەرگیز ئەوەی بە بیردا نەئەهات لە شەوێکی بەو جۆرەدا هیچ جموجولێك بکرێت ـ سپارتاکوس لەگەل سێ یەکێکی هێزە کەی خۆیا ، بێ ئەوەی هاورێکانی تری بزانن ، لە شوێنێکدا ئەو خەندەکەی بە دەوری لەشکرەکەیا هەلکەندرا بۆ(۱) پریان کردەوەو بە سەریا تێیەرینو خۆی ژمارەیەك لە هاورێیانی لە ئەلقەی گەمارۆدانەکە رزگار کرد .

کراسوس کاتێك بەمەی زانی ناچار بو ئابلۆقەو گەمارۆدانەکە

---

(۱) دەسەو دایەرەی کراسوس بە دەوری لەشکرەکەی سپارتاکوسدا خەندەکێکی قولو درێژیان هەلکەندبو بۆ ئەوەی نەتوانن تیا دەربازبن ..

بەجێ بهێڵێت‌و بکەوێتە شوێن سپارتاکوس‌و هاورێـکانی ، بـەم فێلە یان بڵێین بەم (تاکتیك)ە ، هەم سپارتاکوس‌و هەم هاورێـــکانی لـــە دوای شکاندنی ئابلۆقەی گەرمارۆدانەکە ئەوانیش رایان کردو رزگار بون •

کراسوس ، زۆری بۆ هات ، ناچار بو داوای یارمـــەتی لـەرۆم بـکات ، ئەوانیش «پومپە»ی سەرداری گەورەی ئەو سەردەمەیان نارد بە هاواری‌یەوە لەگەل لەشکرێکی چـەند هەزار کەسی‌دا •• چەند جارێك شـــەڕ لــە نێـوان دەستەو تاقمەکـــانی کراسوس‌و شۆرشگێرەکانی سپارتاکوسدا رویدا •

لە شەڕێکی گەورەدا کە لە چیاکانی «بروتیوم» رویدا ، لەشکرەکەی کراسوس شکا •• بەڵام زۆری پێ نەچوو سپارتاکوس لە شەڕەکەدا پێکراو لاقی بریندار بوو شکا • تا دوا کـــاتی سەرە مـــەرگی لەســەر ئەژنۆ ئەرۆیشت‌و بە برینداری لەگەل دەستەو دایەرەکەی کراسوس‌دا شەڕی ئەکرد • بە جۆریک کـــە لە دوای تەواو بونی شەڕەکە لاشەکەیان بۆ نەدۆزرایەوە لەناو لاشەی کوژراوەکانا •

لەم شەڕەدا زیاتر لە هەزار کەس لە نەوە بنەماڵە بەرزەکان‌و بەناو خانەدانەکان بە دەستی کۆیلەکان‌و بە شمشیر کوژران •• بەڵام لـــــە ئەنجامدا شەڕەکە بە نوشوستی کۆیلەکان کۆتایی پێ هات •

کراسوس بە بێ هیچ بەزەییەك دەستی کرد بە کوشتنی کۆیلـــە گیراوەکان ، نزیکەی شەش هەزار کەس ـ بـگرە زیاتریش ـ لــە

(۱) زنجیرە چیایەکی سەختە لـــە ئیتالیا کـــە قوناغی دوەم‌و دوایی شەڕەکەی تیا رودراوە •

کۆیلەکان بە دیل گیران •• کراسوس داوای کرد ئەو دیلانە بە شەش هـەزار داردا هەڵواسن لە سەر رێـگای شاری «کاپۆ» تا دەگاتە روم •

**دەستەی پێنج هەزار کەسی**
**سپارتاکوس ••**

یەکێك لـە دەستە شۆرشگێرەکانی هاورێیانی سپارتاکوس کـە پێنج هەزار کەس ئەبون ، زۆر هەوڵیان دا خۆیان بگەیەننە ناوچـەی ژورووی لـە سنوری وڵاتی رۆم بچنە دەرەوە • بەڵام پومپەی سـەرداری ئەو کاتەی روم[1] خۆی گـەیاندە ناوچەی ژورووی وڵاتو شەرێـکی گەورەی لەگەل شۆرشگێرەکانی پاشماوەی لەشکرەکەی سپارتاکوسدا کردو لە ئەنجامدا شۆرشگێرەکان بەرگەیان نەگرتو تێکشکانو هەمویان کوژران •

بەمکارە پومپـەی سەرداری رۆم ئەویش شانازییەکی پڕ لـە شەرمەزاری بۆ خۆی وەر گرت •

سپارتاکوسو هاورێکانی هەمو کوژران ، بەڵام بـەم راپەرینە ئەوەیان نیشان دا کـە کۆیلەکان لە تێـگەیشتنا تەواوون ، ئەگـەر یەکێتی یان هەبێتو دەستی یەکتر بگرن ئەتوانن ببنە خاوەنی خۆیان •



(١) پومپە کابرایەکی هەڵەکارو بێ بەزەییو رەشبین بووە •

**ئەهمیەتی راپەڕینەکەی سپارتاکوس :**

لێرەدا بە کورتی باسی گرنگی‌و ئەهمیەتی راپەڕینەکەی سپارتاکوس ئەکەین ، کە بۆ لەناو بردن‌و تێکشکاندنی لەشکری سپارتاکوس ئەوەندە توانای سەربازی لەشکری رۆم بە خەرج دراوە کە «سزار»(١) ئیمپەراتۆری رۆم لە ماوەی هەشت ساڵدا بۆ گرتنی فەرەنسەی ئێستا بەکاری هێناوە • لەگەل ئەوەشدا کە شۆرشی سپارتاکوس ـ شورشی کۆیلە راپەڕیوەکان ـ لە دوو ساڵ زیاتر درێژەی نەکێشا ••

لە کۆتایی مانگی مارسی ساڵی ٧١ی پێش زایینی شورشی کۆیلە راپەریوەکان بە دڵساردی کوژایەوە • دوای کوژاندنەوەی ئەو شۆرشە دەوڵەتی رۆم هەڵگرتن‌و بەکار هێنانی چەکی لە لایەن کۆیلەکانەوە قەدەغە کرد • تا رادەیەك ئەمکارەی ئەوەندە بە توندی گرت تەنانەت رۆژێك شوانیکیان بە گوناحی ئەوە کوشتوە کە ئاسکێکی کێوی بە نێزە کوشتبو••

---

(١) ئەو ئیمپەراتۆرەی ماوەی هەشت ساڵ لەگەل فەرەنسەدا کەوتە شەڕەوە •

**پێویستە بەمجۆرە ئەنجامی ئەم راپەرینە مێژووییە لێك بدەینەوە :**

١ ـ ئەگەر بەشخوراوانی کۆمەڵ ، کە زوربەی کۆمەڵن لە هەر کۆمەڵگاو هەر سەرزەمینێکدا یەکێتییان هەبێتو ئامادەی خۆ بەخت کردن بن ، ئەوا ئەتوانن هێزێکی ئەوتۆ پێك بێنن کە دەزگای زۆرو ستەم لەناو بەرن ، راپەرینی سپارتاکوس لەم رووەوە ئەوەندە سامناك بو کە ئەو بێ نەوایانەی ئەم راپەرینەیان بەرپا کردبو بە دڵو گیانەوە ئامادەی شەڕی سەروماڵی بون •• وە لەبەر ئەوەی هیچ شتێکیان نەبو لەم جەنگەدا لە دەستیان بچێت ، بێ پەروا لەگەڵ دوژمنەکانی سەربەستیدا شەڕیان ئەکرد •

٢ ـ هەرکات ، هەژارەکانی هەر کۆمەڵگایەك بیانەوێ دەزگای زۆرو ستەم تێك بشکێنن ، ئەوا پێویستە بەر لە هەموو شتێك ئۆرگانو بەرنامەو نەخشەیەکی تایبەت بەو مەسەلەیان هەبێت ، ئەگەرنا ـ ئەگەر وانەبێت ـ ناتوانن سەرکەوتنی دوایی بە دەست بێنن •

راپەڕینەکەی سپارتاکوس هـەر لەم روەوە بو بـــە ئەنجام نەگەیشت •• کە ژمارەیەك لە هەژارەکان لـــە ئەنجامی بەربەرچـدانەوەی ئەو زۆرەی لێیان کرابو راپەڕین ، بەڵام بەبێ نەخشەیەکی رێك‌و پێك لەگەل یەکتری کۆ بوبونەوە ، ئەگەرچی گیانی لە خۆ بوردنیان تیابو ، بەڵام شێوازی بە دەست هێنانی ئەنجامی تـەواو شارەزا نەبوون(١) •

٣ ـ زۆردارانی کۆمەڵ ، لە هەر لایەك‌و لە هەر کۆمەڵـگا یەکـــدا بن ، هـــەرچی توانایەکیان هەیە لە پێناوی سەرکوتکردنی هەژارەکاندا بە کاری ئەهێنن وە لە هیچ سەرزەنشت‌و شەرمێك کۆ ناکەنەوە • هەرکات بە سەر خەڵـکە ئازادیخوازەکانا سەرکـــەوتن بـەو پەڕی بێ بەزەییانەوە رەفتاریان لەگەڵدا ئەکەن •

کەوابو ، پێویستە هەرکات هـەژارانی کۆمەڵ بیانەوێ بەرەنـگاری زۆرو ستەم ببنەوە ئەبێ ئەوەیان لە بەر چاو بێت کە لە کاتی تێکشکاندنیانا جگە لە مردن هیچ شتێکی تر چاوەروانییان ناکات •• بۆ ئەوەی زیاتر سور بن لەسەر داخوازییەکەیان‌و بەرگە گر تر بن •



---

(١) راپەڕینی سپارتاکوس راپەڕینێکی سەرەتایی‌و بێ ئۆرگان بو

## پاشـــەکی :

وا تێ مەگەن تەنیا رۆشنبیرو خەڵـکی ئازاد بیر لـە ســـەربەستی بکەنەوە ، لە دوا سەدەی بەر لە زایین‌دا(1) یەکەمین شۆڕشی چینایەتیانە لە لایەن دەستەیەك کۆیلەی نەخوێندەوارەوە بەرپا بو ..

«سپارتاکوس»ی شوانی جەنگاوەرو زیرەك ، بۆ یەکەمجـار ناوی راپەڕینی شۆرشگێڕانەی لە روی مێژووی نەتەوە زۆرلێکراوەکانی ئـــەم جیهانەدا تۆمار کردو رابەرایەتی شورشێکی چینـایەتیانەی ئیقلیمگیری کـــرد .

ئەو شوانە مەزنەی کە گەورەترین رێکخراوی شۆرشگێرانەی لـــە ئەڵەمانیادا ، بە شانازی‌یەوە بـــە ناوی‌یەوە دامەزرا .. ئـــەو شـــوانە شۆرشگێڕەی کە بو بە نمونەی ئازایەتی‌و خەبات‌و خۆ فیدا کردن لـــە پێناوی ئازادی‌دا ، سەرمەشقی بیری سەربەستی خوازی بۆ تێکڕای خەڵکی ئەم جیهانە فراوانە کێشا ..

ئەو سەرکردە بلیمەتەی تا ئەو کاتەی دڵی لە لێدان کـــەوت بـــە بریندار‌ی‌و لەسەر چـــۆك بەرامبەر بە سیستەمی کۆمـەڵایەتی کۆیلەیی

---

(1) ٧٣ ـ ٧١ی بەر لەزایینی .

شـەڕی کرد •• ئەو جەنـگاوەرەی کە دوای کۆیلە کردنی ئازادی لەبیر نەچۆوەوە تەقەللای بۆ ئەدا ••

سەرمایەدارە ئابڕو فرۆشەکان بە کڕینو فرۆشتنو بازرگانی کردن بـە زیانو خوێنو چارەنوسو بـە زۆر بـە کۆیلـە کردنی خەڵـکەوە نەئەوەستان ، لە پێناوی کات بردنە سەری کاتێکی خۆیانا چەندان کۆیلەی بە زۆر بە کۆیلە کراویان لە گۆڕەپانی یاریگاکانا ئەکرد بەگژ یەکداو(١) چەکی یەکتر کوشتنیان ئەدان بە دەستەوەو بەریان ئەدانە گیانی یەکتـرو خۆیشیان لەژێر سێبەری چەترە زێڕینەکانی لێواری یاریگاکەدا سەیریان ئەکردنو زیاد لەوەش هـەزاران قسەو جنێو تفیان لەروی کۆیلە ژێر کەوتووەکان ئەکرد •

ئەو بازرگانانەی کە لەسەر قازانجی کڕینو فرۆشتنی ژیانی مرۆڤو بە زۆر بە کۆیلە کردنی خەڵك پێگەیشتبونو ئابڵۆقەی کەرامەتی خەڵـکی بێ دیفاعیان ئەدا ، هەریەکە لـە جێـگای خۆی ئەڵقەیەکی ئەو زنجیرە ستـەمەیان تەواو ئەکرد کـە جەمسەری ئەو سیستەمە کۆمـەڵایەتی یە دواکەوتووەی گرتبوو • بۆیە هـەمو تێـکڕا قازانجیان بە هۆی راپەڕینی کۆیلە شۆرشگێڕەکانەوە کەوتە مەترسی یەوە ••

ئیتالیای ئەو سەردەمە ـ نمونەی ئیتالیای فاشیزم ـ بو بو بە مەڵبەندی ستەمی زۆرداریو مۆڵـگای دەرکەوتووی خاوەن کۆیلە لە جیهانی ستەمو ئابوری ئەو سـەردەمەدا • لەگەل سـەرەتای راپەڕینەکەدا ، تێکڕای خـاوەن کۆیلەکان وەکو سروشتی هەمیشەیی هەمو چینێکی کۆنەپەرستو هـەمو

(١) مەبەست گلادیاتۆرەکانە ••

دەزگــایەکی دامرکێنەر یەکیان گرتو بە هــەرەوەز لە هــەمو لایەکەوە هەڵیان کوتایە سەر مەڵبەندی شۆرشگێڕەکان لە چیای «ئالپ» دا •

کراسوسی ئادەم فرۆش ، کە سامانێکی بێ شوماری لــە ڕێــگای کوشتنو تالانــکردنی خــەڵكو شــەڕی ناوخۆییو شەوکوتــکردنی هەزارەکاندا کۆ کردبۆوە ، بوو بە دەم راستی تێــکڕای ســەرمایەدارە ویژدان فرۆشەکانی رۆم و وەکو کەوا سووری بەر هۆردو کەوتە بــەر لەشکرێکی زیاتر لە پەنجــا هــەزار کەسیەوە[1]و پەلاماری ناوچــە شورشگێڕ نشینەکانی ئیتالیای داو کپ کردنەوەی ئاگری ئەو شۆرشــە مرۆڤایەتیانەی وەکو مۆرکێکی رەش نا بە ناو چەوانی خۆیو هــەمو ساماندارە خاوەن کۆیلەکانی رۆمەوە •

زۆری ژمارەی پەلامــار دەرەکان بۆ سەر شورشەکەو کــەمبونی ئازوخەی شۆرشگێڕەکانو بەفرو بەستەڵەکی زستانو نەبونی ئورگانێکی نیمچەبنچینەیی کە تواناى بە ڕێکخستنی کۆیلە راپەڕیوەکان بشکێ ، ئەمانە هەریەك لــە لای خۆیەوە هۆیەکی سەرەکی گەورە بون بۆ لەناو بردنی ئەو راپەرینە مەزنە پیرۆزە •

راپەڕینی کۆیلەکان ئەوەیان بۆ جیهان سەلماند کە کۆیلە لە ژیریو سەلیقەو تێگەیشتنا تەواونو ئەگەر یەك بن ئەتوانن ببنە خاوەنی خۆیان •

کۆتایی مانگی مارسی ساڵی ٧١ی بەر لەزاینی کۆتایی راپەڕینێکی پڕ لە شەرافەتمەندانەی خەڵکی زۆرلێکراو بو لە بەشێکی ئەم جیهانەدا ، هەروەکو بوو بە سەرەتای سەر

---

(١) چەند جارێك سەرکردەیی دژی شورشەکانی کردوە •

لـــەنوێ زەبرو زەنگ‌و دەست وەشـــاندنی سیستـەمی کۆمـــەلایەتی ـ ئابـــوری کۆیلەداری بێ ئابـــڕو

ئەهمیەتی مێژویی ئەو راپەڕینە لە باری کۆمەڵایەتی یەوە هەتا تایە بووەو ئەبێتە سەرمەشقی ژیانی ئازادیخوازی‌و راپەڕینی هــەموو چین‌و توێژی کۆمەڵــگایەك ••

**ـ وەرگێڕ ـ**

تا ئیستا گــەلێك نوسین لــە بارەی کۆیلەو سیستەمی کۆمەڵایەتی کۆیلەداری‌و راپەڕینی کۆیلەو سەرکردە ئازاکانیانەوە نوسراوەو گــەلێك چیرۆکی شانۆیی‌و سینەمایی لە بارەیانەوە تۆمار کراوە ، بەڵام ئەگـــەر ئیمە واقیع بین بین ، ئەوەندەو چەندان ئەوەندەی تریان لەسەر بنوسرێ هێشتا ناگاتە بەهای ناوەڕۆکی راپەڕینە مێژووییەکەیان ••

ئەم نامیلکەیەش زۆر بە کورتی بەسەرهاتە کەیان ئەگێڕێتەوە ، بەڵام بەڵێن بە خوێندەوارانی بەڕێز ئەدەین ـ ئەگەر بۆمـــان کرا ـ لـــە دەرفەتێکی ترا لە سوچێکی ئەو پرۆژە رۆشنبیری‌یەوە کە بەدەستمانەوەیە باسێکی تری کۆیلەکان پێشکەش بکەین •

**سوپاس :**

سوپاسی برایانی هونەرمەندو خۆشنوس کاك نەوزاد توفیق وکـــاك ساماڵ عەبدولڕەحمان ئەکەم ناونیشانی ئەم نامیلکەیان بۆ نوسیم ..

ژمارەی سپاردنی بە نامەخانەی نیشتمانی لە بەغدا
ژمارە (١١٢٦)ساڵی ١٩٨٤



# ثورة العبيــــد

برهان قانع

١٩٨٤

---

چاپخانەی (الحوادث)

نرخی (٣٠٠) فلسە